# دیوانی مینە جاف

کۆکردنەوەو ڕێکخستنی
مصطفی نەریمان

پێشەکیی
د. حەسەن جاف

# دیوانی میشه‌ جاف

مصطفی نه‌ریمان

پێشه‌کیی

د . حه‌سه‌ن جاف

مطبعة الجاحظ ـ بغداد

# پێشەکی

لەگەڵ سەرهەڵدانی هەر نەتەوەیەکدا جۆرە هەستێکی بەکوڵو پڕسۆزو گەرم بەرانبەر بە خۆشەویستی ئەو نەتەوەو خاکو نیشتمانە لە مێشکو بیرو دڵی ڕۆڵەکانی‌دا پەیدا دەبێ شاعیران لە ڕێزی پێشەوەی کاروانی نەتەوەدۆستی لەگەڵ هەموو دڵخورپیانێکو شۆڕشو سەرکەوتنی میللەتەکەیان‌دا تەزووی خۆشی‌یان بە سەرتاپای لەش‌دادێو شیعرەکانیان بەو هەمتوخوستەوە دەگەشێتەوەو دەخەملێ • حەمەمین بەگی جاف یەکێ لەو شاعیرانەیە کە خۆشەویستیی وڵاتەکەیان لە قووڵاییی ناخیان‌دا ڕیشەی داکوتاوەو خۆشەویستیی نیشتمانەکەیان بە ڕوونی لە شیعرەکانیان‌دا بەرچاودەکەوێ •

مینەجاف کوڕی کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای سەرۆکی هۆزی جافە • لە ساڵی ۱۹۱۱ز دا ، لە قەڵای شیروانە لەدایك‌بووەو لە ساڵی ۱۹۶۵زدا لە شاری بەغدا کۆچی دواییی‌کردووەو لە گۆڕستانی سەیید خەلیل نێژراوە • مینە جاف پیاوێکی هوشیارو جەسوورو خواپەرست بووە • تا بڵێی دەروون‌سافو دەسپاکو یەك‌ڕووو بێ‌ڕیاو ئارایشت‌بووە • بەڵام لەگەڵ ئەم خەسیەتانەی‌دا مرۆڤێکی زۆر دڵناسك‌بوو • وا دیارە هەر لە منداڵی‌یەوە کەریم بەگی باوکی پاش ئەوەی کە ژنی تازەی

دەهێنێ[1] دایکی شاعیرمان لەگەڵ خۆیو حەبیبەخانمی کچیدا لە دێی ( گۆبان ) جێگیر ئەبنو هەر لەو سەردەمەوە باری مەسئولی‌یەتی دەکەوێتە سەرشانو ئەم ڕووداوە کارێکی گەورە لە هەستو دڵودەڕوونی دەکاو جورێ ماتەمی لە ڕوخساریدا هەمیشە خۆیدەنوێنێ • مینەجاف تەحصیلی فێرگەو قوتابخانەی ڕەسمیو دەوڵەتیی نەبووە ، بەلاّم خوێندنی حوجرەی لە مزگەوتی کەلار ، لە خزمەت مامۆستا مەلا محی‌الدینو مامۆستا مەلا ئەحمەدی کەلار دیوە • ئەوەی شایانی باسە ، ناوبراو لە زەمینەی خوێندەواریدا ، خۆی خۆی پێگەیاندووە ، چونکە خودا بەهرەیێکی خوداییو زیرەگی‌یەکی تایبەتی پێ بەخشی بوو • بێ‌گومان جەوی ڕۆشنبیری بنەماڵەی جاف کارێکی گەورەی لە قاڵب‌گرتنی ڕۆشنبیریی شاعیری ناوبراودا بووە ، بە تایبەتی کەریم بەگی باوکی شیعردۆست بووەو دەستی شاعیریشی هەبووەو خاوەن کەشکۆلو کتێوخانە بووە • هەروەها حەسەدبەگ‌ی ڕەزا بەگی مامی کە دوو مرۆڤی ئەدەبدۆست

---

کەریم‌بەگ سێ ژنی هێناوە : (١) دورسون خانم کچی سەرەك‌هۆزی تەرخانی‌یەو لە هۆزی جافەو دایکی شاعیرمانە •

٢ ــ فەهیمە خانمی کچی حاجی عەبدولکەریمی وەنداوی‌یە کە یەکێ لە پیاوماقوولانو ناسراوانی شاری (کفری) بووەو لەم فەهیمە خانمە چوار کوڕو دوو کچی بوون ، کە بریتین لە مستەفاو عەلیو حەسەنو فەتاحو زیباو ئیقباڵ •

٣ ــ کچی وەسمان پاشای جاف کە لە عادیلە خانمەو ئامۆزایشی بووەو منداڵی لێ نەبووە •

بوون ، ئەمانیشی هەر خوێندەوارو خاوەن قەڵەم بوون و لەگەڵ شاعیردا لوتفێکی تایبەتیان هەبووەو هەمیشە هانیان داوە کە بە خوێندن و کەسبی زانست کەرەسەی شاعیری یەتەکەی بەدەس بێنێت و لەم زەمینەیەدا شاعیر درێغیی نەکردووەو زمانی فارسی و عەرەبی و تورکی فێر بووەو بە تایبەتی وەك عادەتی شاعیرانی کۆن لە ئەدەبیاتی فارسی دا قووڵ بۆتەوەو کتێوخانەکەی دیوانی زۆربەی شاعیرە بەرزەکانی فارسیی تێدا بەدەس دەکەوت • لە ڕێڕەوی شیعری کوردی دا شاعیر کەڵکێکی زۆری لە شیعری مەولەویی تاوەگۆزی و مستەفا بەگی کوردی و سەیید فەتاحی جەباری و ناری و حەمە ئاغای دەربەندفەقەرەو پیرەمێردو شێخ ڕەزای تاڵەبانی وەرگرتووەو لەگەڵ شاعیرە هاوچەرخەکاندا موشاعەرەی کردووەو کارێکی زۆریان تێ کردووە ، بەتایبەتی هاوڕێتیی لەگەڵ خوالێخۆشبوو شێخ سەلام و فائیق بێکەس و ئەحۆڵ و ئەحمەد موختار جافدا بووەو بگرە شیعری فائیق بێکەسی زیاتر بەدڵ بووەو ڕێبازی ئەوی لە شیعری نەتەوەیی دا پتر پەسند کردووەو هەر شوێن پێی ئەوی هەڵگرتۆتەوە • تەنانەت کاتێ هەواڵی کۆچی دوایی فائیق بێکەس دەبیسێت ، زۆر نارەحەت دەبێت و بەم شێوەیە بۆی ئەلاوێنێتەوە :

بێ کەسیی کەسی قەومەکەی بێکەس

شەرتە ئێشم بێ تا ئاخر نەفەس

شەرت بێ ئێوارەو سوبح و نیوەڕۆ

تا ئەمرم بڵێم کاك فایقم ڕۆ

تا ئەگاتە ئەو بەیتە شیعرەی کە ئەڵێ :

( بیستو حەوت ساڵە )و ( شەرتە شەرتەکەت )

هەیکەلن بۆ تۆ لەناو قەومەکەت

مینە لە شاعیرانی پیش خۆی ، شیعرەکانی خواڵێخۆشبوو ، پیر مێردی زۆر بەدڵ بووەو بە خاوەنبیرێکی زاناو دانای ئەدایە قەڵەمو هەڵوێستی ئەو کەڵە شاعیرەی دەربارەی بنەماڵەی جاف لەیاد نەکردووەو هەمیشە بە چاوی ڕێزەوە ئەینواڕییە بەرهەمەکانیو بەم بەیتانە سوپاسیکردووە :

ئەی زوبان وەك بولبولی گویا وەرە مەیدانەوە

چەن گوڵی ڕ نگین بەرە دیوانی کوردستانەوە

بیکە نەظمی مەدحو تەعریفو تەشەککورنامەیێ

بۆ ئەدیبی زۆر نەجیبی داهیەی عەللامەوە

نوکتەدانی ، پڕبەیانی ، دوودمانی خانەدان

پیری مەشهوور ، حاجیتۆفیق ، تاجی دەستەی شاعیران

ئەگەر سەرنجێ لە دیوانەکەی شاعیر بدەین ئەبینن شیعرەکانی لەسەرڕێچکەی ڕێبازی شیعری کلاسیکی ڕایەڵ کراوەو بە تەواوی هێزوتینو تەوژمی لەو قوتابخانە شیعرییەوە

وەرگرتووە ، بگرە ئەتوانین بڵێین شیعرەکانی سیماو نیشانەی ئەو قوتابخانە شیعرییەی پێوەدیار و هەر درێژەپیدانی هەمان قوتابخانەیەو پەیڕەویی شاعیرە کلاسیکییەکانی پێش خۆی زۆر بە ئەمانەتەوە کردووە ٠

ئەوەی شایانی باسە شیعرەکانی شاعیرمان لەگەڵ سادەییو ساکاریو ناسکیدا ڕەوانبێژیو یاریکردن بە وشەو جوانکاریی تێدا بەدەردەکەوێ شیعرەکانی لە بۆتەو قاڵبی ماناو ناوەرۆکەوە دەکرێن بە چەند بەشێکەوەو هەر بەشێکی لە بناوانو سەرچاوەییێکی صافو بێگەردەوە هەڵقوڵاوەو هەرچیی بە زوبانا هاتووە لە ناخەوە وتوویەتیو لە هەستێکی خاوێنی ڕاستەوە هاتۆتە بەرهەمو دیارە هەموو ئەو بەشانە لەم لقانەی خوارەوەدا ڕەنگو بۆی خۆیان داوەتەوە ٠

١ ــ شیعرە نیشتمانییەکانی شاعیر لەگەڵ هەموو ڕووداوێکی ڕامیاری میللەتەکەیدا تەفاعولیکردووەو هانی ڕۆڵەکانی میللەتی داوە بۆ ڕزگارکردنی نیشتمانەکەیانو دوورکەوتنەوە لە نیفاقو دوودڵیو ناڵەباریو ئەو ڕیزە شیعرانەی کە بە هۆی لەدایكبوونی زوربەی منالەبەگزادەکانی خزمانیدا هۆنیوەتەوە ، یا ئامۆژگاریی لاوانی بنەماڵەکەی کردووە ، یاوەکو بە هۆی کۆچی دواییی ناسراوانی بنەماڵەکەی شیوەنی بۆکردوونو فرمێسکی بە سۆزی بۆ ڕشتوون لە چوارچیوەی شیعرە نیشتمانییەکانیدا ناڕواتە دەرەوەو هەر لەو چوارچیوەیەدا ئەگونجێنێت ٠

٢ ـ شیعری ئەوینو عیشقو دڵداری کـە بە گشتـی وەسـفی
جوانیو چاوی خومارو قەدو بالای شەنگ ڕووی تابانـی
یارە •
٣ ـ شیعری پاڕانەوەو پیاهەڵدان بە یەزدانو پێغەمبەر(د)و
شێخانو پیاو ماقوولانی ئاییندا کە دەچێتە خانەی شیعری
ئاینیو خواناسی‌یەوە •
٤ ـ شیعری هەجویشی زۆرەو پەپڕەوی مەکتەبی شێخ ڕەزای
تاڵەبانی‌یەو لەبەر توندوتیژیی شیعرەکـانی بلاومـان
نەکردەوە •

شاعیر هەستی کوردایەتیو نیشتمانپەروەریی لە ناخیـــا
ئەبزووێو شێخمەحموودی نەمری بە دروشمی کوردایەتی دێتـە
بەرچاوو تاوەکو دوارۆژی ژیانی لەو بڕوایەدا بـوو کـە شێخ
مەحموودێکی تر نایەتە دنیاوەو کوردستان مەزنێکی وەك ئـەو
بەخۆیەوە نابینێ •

وا بزانم بەشداری‌کردنی شاعیرمان لە شەڕی ئاوباریكدا
لەگەڵ کەریم بەگو داودبەگی مامیو صەدان چەکداری هۆزی
جافداو پشتیوانی‌کردنیان لە خوالێخۆشبوو شێخی نەمر لەوشەڕەدا
کارێکی زۆری لە تەنینەوەی ئانو پۆی فیکری‌دا بووەو هەرگیز
لە ڕێبازی کوردایەتی‌دا لای‌نەداوەو بڕوای تەواوی بەو فیکـرە
هەبووە، • بڕوانە چۆن بە شانازی‌یەوە ئەڵێ :

کێ بوو لە سەر ڕۆژ بەردەرکی سەرا
لە ئاوباریكدا وا دەورەدرا
لەناو دۆڵێکی بێ پەناو دەرا
نۆ سەعات وەك یەك کەوت لە سەنگەرا

له ئەرزو ئاسمان تیرباران کرا

حەمەمین جاف کە ناوی تێکۆشەرانی کورد ئەهێنێت شێخ مەحموود بە یەکەم کەسدادەنێ ، سەیرکە چی ئەڵێ :

ئەووەڵ شێخ مەحموود دارای سێ صەد سوار

چل ساڵ وەکو یەك وێسیا لەسەر بەرد

ئیسماعیل خانیش بە ڕاستی کورد بوو

له ڕێگەی کوردا وا مێشکی ورد بوو

دوکتۆر فوئادیش کوردی نەبەرد بوو

شێخ سەعیدوڵلا تا بێژی مەرد بوو

هەروەها بڕوانە ئەم بەیتانەش ، بزانە چۆنێتیی پێشوازی کردنی تەرمی شێخ مەحموودمان بە چی کوڵو گەسەرێکەوە بۆ ئەگێڕێتەوە :

ئینجا ڕێکەوتین بە (کزی) حاڵۆ

له سولەیمانی لە چەمچەماڵۆ

له ڕێی خورماتوو ، له بەیاتەوە

بڕۆین ، وا تەرمی شێخمان هاتەوە

وەکو وتمان ڕووداوە ڕامیاری‌یەکانی کوردستان کارێـکی گەورەی کردۆتە سەر شاعیرو هەستی هێناوەتە جۆش‌و بە شیعر

هاتۆتە گۆ • بڕوانــە بەبۆنەی ڕووداوی ٦ی ئەیلوولــی ساڵی ١٩٣٠ یەوە چۆن بە سۆزەوە ئەڵێت :

دێتەکوڵ خوێنی گەشی لاشەیی مەقتوول
ئەم قەومە ئەسێنێ حەقی ڕۆژی شەشی ئەیلوول
مەعلوومە کە گوم نابێ لەناو میللەتی کوردا
جێگیرە لە توێی مێشکی هەموو گەورەوو وردا
ئەو خوێنە کە ڕژیایە ئەبەر قاپی سەراتان
تەصدیقی بکەن ، خوێنی سیاوەحشە لە لاتان

پلەی ڕامیاریی شاعیرمان بەرەوپێش دەڕوات • هەر لـە ساڵی (١٩٣٥ز)یەوە کەوتۆتە سەر ئەو خولیایە ، کە کوردستان پێویستی بە خودموختاری هەیەو لـەم بـارەوە ، بـەم شـێوە ، دەمئەکاتەوە ، ئەڵێت :

هەروەکو (مینە) بە شوێن ئەم غایەوو بیرا گەڕێین
حەققی خۆتانە ، مەترسێن حەققە خـۆ سەرنابڕێین

مینەجاف بۆ هەموو کارەساتو ڕووداوێکی ناوچەی عیراق بە کوردو عەرەبەوە دڵی لێیداوەو شیعری بۆ هۆنیوەتەوە ، وەك لافاوەکەی ساڵی ١٩٥٧ لە سلێمانی و لافاوەکـەی قزرەباتو چەلەولاو بوومەلەرزەکـەی کوردستانی ئێرانو نەگبـەتیو ستەملێکرانی فەلەستینییەکانو درۆودەلەسەی سەردەمی کەریم

ناسمو پەیدابوونی یانـەی سەرکـەوتنو دەرچوونی کۆواری
شەفەق )و هتد ...
هەروەك لەبەرەوە باسمانکرد ، بە بۆنەی لەدایکبوونـی
ەوزادانی جافەوە شیعری هۆنیوەتەوەو مێژووی لەدایکبوونیانی
بە شێوەی ئەبجەد تۆمارکردووە . هەروەها کە لە لانکدابوون ،
بە لایلایەی جوان بانگی کوردایەتیی بەگوێیاندا هەڵـداوە .
بڕوانە چەند بەسۆزەوە لایلایە بۆ حەسەنی برای دەکاو دەڵێ :

هەی لایەلایە حەسەن لایلایە
لە خوام گەرەکە بگەیتە پایە
پایەت بڵندبێ ، بەرزبێ مەقامت
بەو شەرت سەربەرزیی کورد بێ مەرامت
هیواو خەیاڵت حورڕیی کوردان بێ
ڕۆحت فیدایی ڕێی نیشتمان بێ
چاوت لە بەرزیو ژینی وڵات بێ
فیدایی وەتەن لە لات خەڵات بێ
کۆرپەم گوێ بگرە لە دەنگی دایە
بە دڵی پڕغەم بۆت ئەکا لایە
پەردەی دڵەکەم پڕ لە خوێناوە
بۆ زەلیلیی کورد جەرگم بڕاوە

هەی لایە لایە حەسەن لایلایە

کەی لە ژێردەسی ڕزگار بووینایە

مینە جافی شاعیرمان لەبەر ئەوەی لە موحیتێکی ئاینیدا گەورە بووەو ئەو موحیتە تەئسیرێکی فراوانی کردۆتە سەر بیروباوەڕی ، بڕوانە لەم شیعرەدا چۆن ستایشی یەزدانی گەورەی کردووە :

ئەی خوا تۆ خواییوو تەعریفت بۆ من ناکرێ ( ؟ )
ئیقتیدارو قودرەتت تەوسیفی بۆ من ناکرێ

چونکە ئەم زوانەی کە مەدحی تۆ دەکا مەسنووعی تۆن
وا دروسکریاوە هەرگیز حەللی بۆ من ناکرێ

❋ ❋ ❋

لە شوێنێکی تریشدا ئەڵێت :

ئاگرینم ، دڵبرینم ، چاونمینم ، پڕگڕین

بێموعینم ، دڵخەمینم ، ئێش لە لام بێئینتیها

گەستە جەرگم ، خەستە مەرگم ، زامە بەرگم ، خوێن خوراك

زەردە ڕەنگم ، قەطعە دەنگم ، زۆر بەتەنگم ڕەببیا

سا بە ڕەحمی خۆت خوایا ، چارەیی ئەم کارەکە

غەیری تۆ لای کێ بچێ ( مینە ) بە هاوار هادیا

❋ ❋ ❋

مینە جافی شاعیرمان لە ستایشی پێغەمبەری گەورەمان
د•خ ) پارچە شیعرێکی مستەفا بەگی کوردیی بە پێنج
شتەکییەك ڕازاندۆتەوەو دەڵێ :

صەد کەڕڕەت حەددی نییە « مینە » کە مەدحی تۆ بکا

لێك هەتا ئەمرێت ئەڵێت ئەم بەیتە لێل ئاوازی دەف

( انت ختم المرسلین ، انت امام المتقین

انت فخر المؤمنین ، انت شفیع المذنبین )

بەڵام کاتێ کە تەوژمی نەهامەتیو کارەسات نینۆکی
خوێناویی لە لەشی گیردەکاو کوڕێکی لاویو کچێکی عازەبی
ە بارودۆخێکی تایبەتیداو لە فاصلەیەکی کەمدا کۆچی دوایی
ەکەن ، پەردەی خۆڕاگریی ئەدڕێو ناچار ڕوو ئەکاتە یەزدان ،
بە تووڕەییەوە سکاڵای وەزعی خۆی لە پەنای
نەتەوەکەیەوە دەکاتو ئەڵێت :

ئەی فەلەك بۆ کورد کوڕی تۆی کوشت ، برای تۆی سەربڕی
قاپیی کەعبەی شکاند ، یا پەردەیی بەیتی دڕی ؟

بۆ لە هەر لایێ بە ئاوی چاوو خوێناوی جگەر :

ناکام غونچەیێکی ئارەزووم بڕوێ بە ناکام ئەیبڕی ؟

شاعیران لە ڕیزی پێشەوەی کاروانی نەتەوەدۆستیدا ،
میللەتەکانیاندا تەزووی خۆشییان بە سەرتاپای لەشیاندا
دەگەڕێو شیعرەکانیان دەگەشێتەوەو دەخەملێ ، حەمەمین بەگی

جاف یەکێك لەو شاعیرانەیە کە خۆشەویستیی نەتەوەکەی لە قوولاییی ناخیدا ڕیشەی داکوتاوەو خۆشەویستیی نیشتمانەکەی بە گەشی لە شیعرەکانیدا دەدرەوشێتەوە :

ئەی وەتەن زۆر دڵبەرە دەشتو دیارە جوانەکەت
نەشئەبەخشایە بە حەققەت مەنزەرەو سەیرانەکەت
ئیشتیباهی لا ئەچێت ، بێ فێڵ ئەڵێت ڕیزوان هەیە
هەر کەسێ بڕواتە سەیری شاخو دارستانەکەت
ئەی وەتەن دڵگەرمە ، ئیمڕۆ من طەلەبکارم لە حەق
زوو بە زوو پاڵتاوی ئازادی بکەیتە شانەکەت

ئیتر لە کۆتاییدا چەند وشەیێك کە پێویستە بگوترێ ئەوەیە کە مامۆستا سەیید مستەفا نەریمان هاندەری بنەماڵەی شاعیر بوو بۆ ئەوەی کە ئەم دیوانەی شاعیر ڕووناکی ببینێو بەرپرسیاریی کۆکردنەوەو نووسینەوەی دیوانەکەی خستە ئەستۆی خۆیو لەم زەمینەیەدا گیروگرفتێکی زۆری هاتەڕێ ، چونکە دیوانەکەی هەڵسوکەوتی ڕۆژگار زۆری کارتێکردبوو شێوەی نووسینەوەکەی لە ئەسڵدا بە خەتی نیمچە فارسیبووو هێنیدێکیشی بە خەتی لاوێکی جاف نووسراوبوو کە خوێندنەوەی زۆر ئاسان نەبووو بگرە شاعیر شێوە ئیملایەکی تایبەتی خۆی لە نووسینەوەدا بەکارهێنابوو · بەڕاستی ئەم زەحمەتەی مامۆستا نەریمان شایانی تەقدیرەو سوپاسی دەکەین ·

نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کــە سەرتیپــی کــوڕی شاعیریشــ هەرچەندە ئەرکی تەبیعیی سەرشانی بــووە کــە ئــەم دیوانــە بپارێزێ ، بەلاّم لەگەڵ ئەم هەموو هەڵسوکەوتی ڕۆژگارەدا ، توانیویە بیپارێزێو ئەویش بەش بە حاڵی خۆی جێی سوپاسە ٠

**د٠ حەسەن جاف**

## هاوارکردن له قاپیی خوا ، شەوی ٤ / ١٢ / ١٩٦٢ نووسراوه

یالّلا وه حاجەت سپیدەی ئەکرەم
( محمد ) فەخری ئەولادی ئادەم
ئەو شاسوارەی عەرصەی لامەکان
ئەو شاهبازەی سەرپاك بوونیان
ئەو سالاری دین ، ئەو سولّتانیدین
شەفیعی عالەم ( ختم المرسلین )
سپیدەی سورروور ، کافقەی مەخلووقات
شەفاعەتکەری ڕۆژی عەرەسات
شەهەنشای لەقەب ( طەو یاسین )
خەلاسکونەندەی هەموو موزنیبین
بمکه به خاتر ئەو بەرگوزیده
ببەخشه دەوای دەردم جەدیده
هەرچەنده یاخیو خەجالّەتبارم
ڕووسیای قاپیی پەروەردگارم

موتیعی ئەمری نەفسی شەیتانم
پشت خەمیدەی ژێر باری عیصیانم
تاعەتکەمکردە ، بێ عیبادەتم
مەعصییەتبارو هەم خەجاڵەتم
داخلی گرۆی گوناهبارانم
سەربەزمی حەڵقەی شەرمەسارانم
ئەووەڵ عەفوکە باری گوناهم
قوبووڵکە تۆبەم ئەی پادشاهم
دووهەم وەحاجەت ئەو بەرگوزیدە
ببەخشە دەوای دەردم جەدیدە
ئەووەڵ شایەتیم وە تۆ ئاوەردەن
ئیقرارم وە لەفز تەنهاییت کەردەن
تەسدیقی وەحیی نوبووەت کەردم
وە ڕەسولوڵلا ئیمان هاوەردم
هەرچی جە قورئان حاصلکراوە
وە شەرعی شەریف نامش براوە
باوەڕم پێ هەس پەرێم بوو یەقین
حەتا نەکەردەن عالمانی دین

هەرچی تۆ فەرمووت وە نەبی ئەفخەم
ئەوانیش وایان وتوە بە عالەم
تۆبە یارەببی تۆبەی نەسووحی
لە کرداری بەد موژدەی مەقبووحی
تۆبەم بۆ چە گشت کردەیی بەدە
چە ئەفعالی بەد هەرچی وێمکەردە
ببەخشە باری گوناهم یەکسەر
لە ئەوحولمەحفووز ئەمری عەفومدە

# ئەی خوا

ئەی خوا تۆ خۆت خوای تەعریفت بۆ من ناکرێ
ئیقتیدارو قودرەتت تەوسیفی بۆ من ناکرێ
چونکە ئەم زوانەی کە مەدحی تۆ ئەکا مەسنووعی تۆس
وا دروس‌کریاوە هەرگیز حەللی بۆ من ناکرێ
گەر کەسێ ئەم لافە لێدا ، بێژێ وەسفی خوا ئەکەم
هێندە بێ دەرك‌و عولوومە بەحسی بۆ من ناکرێ
چون بەشەر ناتوانێ کەشفی ئیقتیداری تۆ بکا
جا خەیاڵ چۆنی بکا ، مەعلوومە بۆ من ناکرێ
هەر ئەوەندەی لێ ئەزانم ، خالیقی دوو کەونی تۆ
ڕازیقی چەن نەوعە جنسی ، عەددی بۆ من ناکرێ
زیاد لەمە هەرچی بڵێم لام زیادەیەو بێ جێگەیە
چونکە نازانم بڵێم چی صەعبە بۆ من ناکرێ
یا وەکو (مینە) دەبێ خۆم وەحشی‌وو جاهیل بکەم
یا دەبێ بێژم ئیلاهی مەدحی تۆم بۆ ناکرێ

* * *

## پاڕانەوە لە یەزدان

ئەی خوا تو خوا بە لوتفت چاری کاری من بکە
مەلهەمی ڕەحمت ئەزامی جەرگی زاری من بکە
عاجزو غەمگینو بێکەس دەس بە ئەژنۆ قۆڕبەسەر
بێ دەرو بێ مەلجەئم ،یا ڕەببی چاری من بکە
ڕێگەبۆ هیچ کوێ نی‌یە هەرچی دەرە بەسراوە لێم
تۆ دەوایی دەردەکەم ، پەروەردگاریی من بکە
وشکە گولزاری نیشاتو مەزرەعەی ژینم خوا
تۆ بە هەوری لوتفەکەت ڕەحمێ بە زاریی من بکە

* * *

## ئەی خوا

ئەی خوا یاخیو خەجاڵەتبارم
ڕووسیای قاپیی پەروەردگارم
موتیعی ئەمری نەفسو شەیتانم
پشت خەمیدەی ژێر باری عیصیانم
تاعەت گومکردو بێ بیضاعەتم
مەعصیەتبارو هەم خەجاڵەتم
مەحجووبی زومرەی گوناهبارانم
سەرحەڵقەی مەجلیس شەرمەسارانم
لە بەدکرداری نەمکردووە تەقصیر
بەدئەتواری خۆم ڕووی کردوومە قیر

❋ ❋ ❋

## ئەی دلیلی بێ دەلیل

ئەی دەلیلی بێ دەلیل‌و ئەی نەوایی بێ نەوا
ئەی ئەمیری بێ ئەمیرو ئەی خودایی بێ خوا
ئەی شەهەنشاهی سەری دین هیمی موڵکی لامەکان
حامیی بێ مەرجەع‌و ئەی مەرجەعی گشت ئیلتیجا
دەستگیری زومرەیی داماوو مەحزوون‌و زەلیل
هادییی بێچارەیی ئەوگاری بێ پشت‌و پەنا
مەڵهەمی زام‌و برینی کاففەیی خوێنی دڵان
شەربەتی تەسکینی ئاری جەرگی پڕ سۆزو سزا
ئەی کلیلی پێوەنی پێوەنکراوی ئێش‌و خەم
شافیی بیماری مەعلوول‌و دەوایی بێ دەوا
ڕابەری ئاوارەیی سارایی پایانی دەردوئیلتیجا
ئۆکسی ڕێگەی وێڵی هەردەی زوڵمەت‌و کەرب‌و بەلا
بۆ ڕجا دینمە تکا ، تا بۆم تکاکار بێ لەلات
شوعلەیی نوورو صەفای سیمایی‌زاتی مستەفا

بمکه خاتر تاعەتو تەصدیقو تەقوایان هەموو
کاففەیی ئەصحابو ئەهلی بەیتی بێ بوغزو ڕیا
ئاگرینم ، دڵبرینم ، چاونمینم ، پڕگرین
بێ موعینم ، دڵخەمینم ، ئێش لە لام بێئینتیها
گەستەجەرگم . خەستەمەرگم ، زامەبەرگم ، خوێنخۆراك
زاەردە ڕەنگم . قەتعە دەنگم ، زۆر بە تەنگم ڕەببەنا
سا بە ڕەحمی خۆت خوایا ، چارەیی ئەم کارە کە
غەیری تۆ لای کێ بچێ (مینە) ، دە هاوار هادیا

## پاڕانەوە لە خوا

یا ئیلاهی ، سا بە لوتفت ڕەحمێ ، وا تاقەت نەما
بۆم بنێرە زوو دەلیلێ شووشەیی سەبرم شکا
غەرقی بەحری گێژی غەم ، لوولم ئەدا گێژی خەفەت
وام لە حاڵی مردنا ، هاوارە ، ئەی ڕەببی سەما
ئەی دەلیلی بێ دەلیلو ئەی ( غیاث المستغیث )
( یا مجیب الدعوات )و یا دەوایی بێ دەوا
کارسازی جوملە داماوو فەقیرو بێ نەوا
سا نەجاتم دە بە ڕەحمەت ، تۆ خودایی ئەی خوا
( یا امان الخائفین ) ویا ( مجیب السائلین )
یا ( طبیب العلل )و یا شافیی صاحیب شیفا
دێنمە ئەرجو ئە قاپیت عیززەتی ئایەی شەریف
بمکە خاتر پرتەوی نوورو ضیایی ئەنبیا
دەیکەمە ڕەهبەر لە لای تۆ بۆ شەفیعی کارەکەم
حورمەتی ئەصحابو ئالو ئەهلی بەیتی مستەفا
(مینە)یی بێچارە یارەببی زەلیلو بێکەسە
( ادفع احزانی ویسر لی اموری ربنا )

* * *

## حەوتبەندێ لە ثەنای حەزرەتی ( محمد )دروودی خوای لەسەربێ

مەرحەبا ئەی شاهی دەوران ، ڕەحمەتەن لیلعالەمین
مەرحەبا ئەی شەهسواری مەحشەرو سالاری دین
مەرحەبا ئەی مەدحی تۆ یاسینو تاهاو ( والضحی )
مەرحەبا ئەی ئەشرەفی مەخلووقو خەتمولمورسەلین
ئەی نەبیی با صەفا ، ئەی ئیسمی زاتت مستەفا
ئەی لە نووری تۆ مونەووەر مەشریقو مەغریب زەمین
مەرحەبا ئەی فەخری ئادەم ، فەخری عالەم مەرحەبا
ئەی حەبیبی زاتی یەزدانو شەفیعولموزنیبین
تۆ کە مادام ڕەحمەتەن لیلعالەمین دەرشانتە
یا ڕەسوولەڵلا ڕەجایێ بۆ منی ماتو حەزین
کەس نییە ڕووی تێبکەم ، کەس نییە دەستگیری من
غەیری تۆ لای کێ بەرم هاوار ئیمامەلموتتەقین
نابێ مەئیووس بم لە لوتفت ، نووری خۆت تێرمە ڕجا
تا ڕجام تۆ بۆبکەی بۆ دینو بۆ تەجهیزی ژین

یا ڕەسوولەڵڵا بە جاهی خۆت لە خۆت داوا ئەکەم
لای خوا فەرمووی ڕجایێ بۆ سەگی قاپیت ئەمین
هەرچی مەدحی تۆ بکەم ، خەتمی بە من قەت ناکرێ
لایقە ئەم بەیتە بۆ تۆ صاحیبی تاج‌ونگین
( انت ختم المرسلین ، انت امام المتقین )
( انت فخر المؤمنین ، انت شفیع المذنبین )
پرتەوی نوورت جیهانی کرد مونەووەر سەرووەرا
موعجیزەی تۆ بوو لە غەیبۆ ، تاقی‌کیسرا شەق‌کرا
ئەو دەمەی شەمسی نوبووەت شوعلەیی دەرخست لە ڕووت
لەو شوعاع‌و شوعلە ، شاها ! کوفرو زوڵمەت لابرا
شەعشەعەی سەوتی ڕەسوولوڵڵاهی تۆ کریا عەیان
یەك کەڕەت بازاڕی کوفرو لات‌و عوززا داخرا
ڕوتبەوو تاجی شەفاعەت لاییقی هیچ کەس نەبوو
تا بەشیری نووری تۆ ئەم دینە قاپی لادرا
دین لە دونیادا نەمابوو ، کەعبە وەك شێخانە بوو
تا بە شیری نووری تۆ ئەم دینە قاپیی لادرا
لێت‌ئەکەم ئەرجو ، شەها ! تۆ جاهی ئەو کاتەی کە بۆت
هات خەڵات قورئان‌و تۆ ئەم ئاییینەت بۆ دانرا

بەحری جۆشش بێتە جۆشش ، لوتفت بێ ، عاجز نەبی

دەرحەقی من ئیلتیجایێ فەرموو ئەی فەخرولوەرا

دڵ بە دوو ئێش پڕ لە خوێنە کەس نی‌یە تیماری کا

من پەنام هێنا بە تۆ ، ئەی صاحیبی هەر بێ پەنا

خۆت‌و لوتف‌و هیممەتت ، شاها ! پەنام هێناوە من

یا ڕەسوولوڵلا پەنای تۆ نەی‌بووە چوون‌و چرا

باغەوانی وەسفی تۆم ، نابێ کە من دلگیر بکەی

لێت ئەکەم ئەرجوی شەفاعەت ، شافیعی هەردوو سەرا

نابێ بێ لوتف بی لە حەققم ، تا نەجاتی من ئەدەی

تۆوو جاهی خۆت‌و ئەم بەیتە کە وا بۆت بێژرا

( انت ختم المرسلين ، انت امام المتقين )

( انت فخر المؤمنين ، انت شفيع المذنبين )

ئەی لە نووری تۆ سەراسەر ڕوبعی مەسکوون پڕلەنوور

وەی لە یومنی تۆ جیهان پڕ کەیف‌و شەوق‌و پڕسورووور

وەی لە فەزڵی تۆ عەرەب ئەفزەڵتری کاففەی بەشەر

وەی لە فەیزی تۆ مەدینە ئیشی ئەقصاو کێوی توور

پرتەوی خورشیدی کوڵمت ئافتابی موڵکی دین

بێ شەوە ئەم ڕۆژە ، نای‌بینێ ئەبەد کەسروکوسوور

وەسفی سیمای تۆیە شاها ! ویردو ئەورادی مەلەك
پرتەوی ڕووی تۆیە شوعلەی سوورەتی غیلمان‌و حوور
لێت ئەکەم ئەرجو لە قاپیت ، ئەی شەهی کیشوەرگوشا
هەم شەفیع بی بۆ زەلیلیم ، هەم شەفیعم بۆ قوصوور
زۆر هیوادارم کە من غافیل نەبم لات لەو دەمەی
تۆ شەفیعولموزنیبین‌و عاصی‌یان دەچنە حوضوور
هەرچی هەوڵمدا کە نەعتی تۆ بکەم ، بۆم ڕێك نەکەوت
من ئەڵێم ئەم بەیتە بۆ مەدحت هەتاکو نەفخی صوور
( انت ختم المرسلین ، انت امام المتقین )
( انت فخر المؤمنین ، انت شفیع المذنبین )
« ای همه زیبای آن زیبا رخان از روی تو

ای عبیر جنت از آن جعد عنبر بوی تو
گشته‌است جنت ز عکس روی تو پر حسن و زیب
دلبر عرعر از آن قامت دلجوی تو
هست نقش روی مه خط غلام عارضت
پیچ زلف یاسمن از تاب آن گیسوی تو
یوسف کنعان بداغ از حسن‌و زیب صورتت
گشته خم پشت هلال از حسرت ابروی تو

لعل و گوهر بی رواج افتاده‌اند اندر جهان
زان زمان دیدند عالم آن لب لولوی تو
نرگس شهلا شده بیمار اندر بوستان
از خدنگ غمزهء دو دیدهء ابروی تو
ورد سازم بر زبانم از سحرگه تا غروب
این کلام دلربا از صحن و اندر کوی تو »
( انت ختم المرسلین ، انت امام المتقین )
( انت فخر المؤمنین ، انت شفیع المذنبین )
« اسلام ای شمس رخشان عرب ، فخر عجم
اسلام از تو مزین گشته گلزار ارم
اسلام ای نور یزدان در جبینت جایگر
سرور خلعت رسالت ، صاحب تاج و علم
گشته از یمن قدومت کفر و ظلمت بی اثر
پر ضیا بنموده نورت مشرق و مغرب بهم
حق به ( سبحان الذی اسری به ) بردت پیش خود
تختگاهت قاب قوسین و ثنا ( ن والقلم )
بهر آن عزت که حق دادت دنی‌ات خواند او
( کن رجائی ) بهر من ای سرور مولی النعم

گشته‌ام از زهر ذلت خون دل و بریان درون
لطف فرما و دوا کن دردم ای صاحب کرم
تو که او صافت ز حق والشمس واللیل آمده‌است
بندهٔ مسکین چه دانم مدح ذات‌را کنم !
این قدر دانم که تا باشد روانم در بدن
بر زبان این بیت رانم از نبی محترم
( انت ختم المرسلین ، انت امام المتقین )
( انت فخر المؤمنین ، انت شفیع المذنبین )
ئەی نەبیی ئوممەت پەناھ‌و ئەی ڕەسوولی مونتەخەب
صاحیبی میعراج‌و تاج‌و سەروەری عالی‌نەسەب
حاکمی عاصی‌پەناھ‌و شەھریاری موڵکی دین
ئەی ئەمیری بێ نەزیرو فەخری ئافاق‌و عەرەب
ئەی لە ئایینی شەریفت جوملە ئایین پڕشەرەف
ئەی ( محمد ) ئیسمی زاتت ( احمد )و ( محمود ) لەقەب
لەو دەمەی تەشریفت بردو عەرشی عالیت کردە فەرش
ئاسمان پڕ شەوق‌و زەوقە ، ساکینانی پڕ تەرەب
مەنبەعی ئیحسان‌و عەدلی دادخواھی عالەمی
یا ڕەسولەڵلا چی‌یە ، ناپرسی دادم ئەلعەجەب

صەد کەڕەت بێم‌و لە قاپی تۆدەرەم‌کەی سوێن بە تۆ
تێمەوە ، ناڕۆم ، هەتا ئەمرم ئەکەم مەقصەد تەڵەب
مەقصەدم ئیجرا بکە توبیت‌و تو نووری خوا
لێم مەبە عاجز لە مەئیوسییی خۆم بووم بێ ئەدەب
سەعی ئەکەم وەصفت بکەم بۆم نایە ، ئەمما تا ئەژیم
ویردمە ئەم بەیتە ، داییم سەروەری والاحەسەب
( انت ختم المرسلین ، انت امام المتقین )
( انت فخر المؤمنین ، انت شفیع المذنبین )
مەسنەدئارایی ڕیسالەت ، شەهریاری باشەرەف
شوعلەئەفرووزی نوبووەت ، فەخری ئافاق‌و سەلەف
ئەی لە نوورت بەهرەوەربوون ئەنبیاوو ئەولیا
ئەی بە شیری تۆ سەراسەر دینی کافر بو تەلەف
تێنمە ئەرجو ئە قاپیت ، ئەی شەهی کیشوەرگوشا !
عیززەتی بووبەکرو عوسمان‌و عومەر ، شاهی نەجەف
بۆم بفەرموو ئیلتجایێ لای خودایی لایەزال
بەل نەجاتم بێ لە بەحری زیللەت‌و عیجزو ئەسەف
قاپیی ئەلطافی یەزدانی لە ڕووی من لادرێ

بێ نوزوولی ڕەحمەتی باری لە حەق من هەر تەرەف
صەد کەڕڕەت حەددی نی‌یە (مینە) کە مەدحی تۆ بکا
لێك هەتا ئەمرێت ئەڵێ ئەم بەیتە لێل ئاوازی دەف
( انت ختم المرسلين ، انت امام المتقين )
( انت فخر المؤمنين ، انت شفيع المذنبين )

* * *

## ستایشی پێغەمبەر (د٠خ)

قومری‌یی باغی ( فأوحی ) هەم ( شفیع المذنبین )
شەمسی ڕەخشانی نوبووەت ( رحمةً للعالمین )
ئەو شەوە ئەو شاه بوو بە شاهبازی لامەکان
گەیی‌یە ڕوتبەی ( قاب قوسین ) ( نبی المرسلین )
چی بە وی ڕازی نەبوو پەروازی کرد لەو مەسکەنە
تا کن ( او ادنی ) نەوێستاوە ( امام المتقین )
وا مونەووەر بوو لە نووری عالەم‌ئارای مستەفا
هەر لە ئەووەڵ ئاسمان تا ئاسمانی حەوتەمین
عەرش‌و چەرخی ئەتڵەسی‌وو (سدرە)وو هەم لامەکان
جەننەت‌و ئافاق‌و ، دەوران ، شەرق ، تا غەربی زەمین
بوو بە یەك شوعلە لە نووری حەق درەخشان ئەو شەوە
دەنگی ( سبحان الذي اسری بعبده ) بوو یەقین
یاڕەسووڵڵا دەخیلت بم قوبووڵم‌کەی بە سەگ
بابڵێن (مینە) گەیشتە کەلبی ( فخر المرسلین )

## دیسان ستایشی پێغەمبەر (د•خ)

یا ڕەسووڵەڵلا مەدەد بەسراوە لێم قاپیی نەجات
زوو بە لوتفت بگرە دەستم شاهـو فەخری کائینات
ڕوو ئە هەر لایێ ئەکەم ، ڕێگەم نییە سا ڕەحمەتێ
ڕووڕەش‌و بێچارە وا ڕووم‌کردە قاپیی بارەگات
دڵ بە خوێن‌و خەستەجەرگ‌و دیدە پڕئاوو نمین
بێ کەس‌و بێ مەرجەعم ، خۆم خستە ژێر سایەو پەنات
تۆ شەهەنشاهی سڕی دێهیمی خەتمولمورسەلین
سا تەرەححوم کە بە حاڵم من فیدایی خاکی پات
بێ پەناوو بێ نەوا ، بێ دەستگیرو تۆ ئومێد
هەر لە بەر مەحزی خودا قوربان لە گەنجینەی سەخات
مەرحەمەت فەرموو بە غەمباری‌و زەلیلی‌و بێ دەریم
چارەیی ئەم دەردەکە پێم بەخشە تۆ قەبزەی بەرات
وا لە دەس زوڵم‌و جەفا (مینە) بەدەم ئێشی دەروون
ئەم عەریضەی دایە خزمەت ، سەروەرا ! هاوار لە لات

پەناھ بۆ حەزرەتی غەوث لــە وەختێکا بە نەخۆشیی ژانو با دەستو پێم ئاوسابوو ، بە دارەمەیت هەڵیان ئەگرتم ، چوومە بەغداد چوومە قاپیی سەرداری ئەولیا حەزرەتی غەوث پایەی بڵندتر بێ • مانگی حەوتی ساڵی ١٩٥٧ بــوو ، ئــەم پارچــە شیعرەم بۆ هات •

یاغەوث شابازی زاتی «الله»ی تۆ

یا غەوث نازداری « رسول الله »ی تۆ

قەسەمت ئەدەم بە شەوی میعراج

کە فەخری عالەم بوو بە صاحێب تاج

قەسەمت ئەدەم بە ڕوتبەی (دنا )

ئەو شەوی بە لوتف ئەیفەرموو خوا

بمکە بە خاتر نووری پێغەمبەر

بەسە بەس بمکە موحتاج بە دوختەر

لە ڕووی لوتفەوە بە نیونەزەرێ

بەرکە وەلامۆ ، فەرەحیم دەرێ

بووم بە جێی بازیو گەمەی نەفامان

شا عەبدولقادر ، دەسم وەدامان

ئەووەڵ بە خوا هەم بە پێغەمبەر

بە بێ گوناهیی « حسین » سەروەر

ڕجایێ بۆ ئەم ڕەزالەتیمە

بۆ ئەم مجرۆییو کەسالەتیمە

بەڵکو نەجاتم بدەی لەم حاڵە

بە دەس دەردو ئێش حاڵم بەدحاڵە

شا عەبدولقادر بۆ خاتر قورئان

سەرتیپ نەجاتدەی لە ئێشو دەردان

یا غەوث من پەنام وە پەناداره

لاڵەم لە قاپیی غەوثی نازداره

پەنام هێناوه بێ چار و پەنا

یا غەوث من وە تۆ،تۆیش وەلای خوا

ئەنای حەزرەتی غەوث ( قُدِّسَ سِرُّهُ )

❋ ❋ ❋

# بۆ شاهی گەیلانی

شاهبازی ئەولیا ، ئەی شاهی گەیلانی لەقەب

ئەی بە ڕوتبەی شاهبازی ئەولیا بووی مونتەخەب

ڕوتبەیی شابازی بۆ شانت کەمە ئەی شەهریار

بۆیە ڕوتبەی تۆ بە ( غوث الاعظم )ی دریاقەرار

لاییقیت بۆ بەرزیی ڕوتبە لە لای زاتی خوا

بۆیە تەرفیعی نیشانت تۆ بە ( محيالدين ) کرا

کەس بە ڕوتبەی تۆ نەبوو نائیل لە نەسلی شای عەرەب

شاهبازی ئەولیاوو هەم « رسول الله » نەسەب

بمکە خاتر لوتفی ئەو یەزدانە تۆی کرد بێ نیاز

بەم هەموو ڕوتبە زلانە تۆی کە کردە شاهباز

هەم ببەخشە من بە جاهی شای شەفیعولموزنبین

لای خوا فەرموو ڕجایێ بۆ سەگی قاپیت ئەمین

تۆ ئەبێ ئەرجو بکەی قوربان کە ( غوث الاعظمی )

کارییە ئەم دەردە ، لوتفی تۆیە تەنها مەڵهەمی

ڕوو ئە قاپیی تۆ ئەکەم ، هەر تۆی ڕجام ، تۆ بۆم بکەی
تۆ ڕجام گەر بۆ نەکەی ، ئیتر هەواڵەی کوێم ئەکەی ؟
ئەی شەها بیبەخشە (مینە) تو خوا سا ڕەحمەتێ
دەردی کاری ئەودەواکە ، ئەی خوا سا هیمەتی

# ئـەی خـودا

ئەی خودا هەر تۆ خودایی لامەکانی ئەی خودا
دافیعی دەردو دەوایی زامەکانی ئەی خودا
چارەسازی کاری بێچارەی هەموو مەزڵوومی تۆ
پڕ لە خوێناوە دڵم ، دەرمانی ژانی تۆی خودا
وەختە ڕۆحم بێتەدەر ڕەببی بە دەستی ئێشەوە
س بە ڕەحمو مەرحەمەت بیکە عیلاجی دەردەکەم
خۆت حەکیمی ، خۆت تەبیبی دەردەکانی ئەی خودا
صەد هەزاران دڵ بە خوێن شاد بووگە (مینە)ش شاد بکە
تۆ شیفای دەردی دەروون خوێناوەکانی ئەی خودا

❋ ❋ ❋

## لالانەوە لە دەرگای ( عثمان برندە )
## بۆ چاو ئێشە . لە ١٠/٤/١٩٣٣دا وتراوە .

عثمان فیدات بام ، عثمان فیدات بام
عثمان وە فیدای خاکی دەرگات بام
چون قۆچی قوربان قۆچی بەرپات بام
قوربانی خۆتو مەکانو جات بام
عثمان من پەنام پەی دەوای ئەی دەرد
وە قاپیی خەیلێ مەردی مەیدان بەرد
ئێدەن وە دەرگات پەنام ئاوەردەن
ڕووی لالەم وە لای شا عثمان کەردەن
لای خەیلێ مەردان من ئەی لالەم کەرد
هەرچەن لالیام جە دەرگای مەردان
کەس نەکەرد پەرێم دەوای ئەی دەردان
وە خەجالەتی ئامامۆ وە لات
چون هوونی کەفتم جە پای بارەگات

مبۆ نەزانیم ئەمجار جەی بابە

پەی چێش صاحێوباب عالیجەنابە

دڵ زەلیل مەندەن وە ئەی زامەوە

بدەر نەجاتم جە ئەی دامەوە

ئیتر سا قوربان ، تۆ وێت مەزانی

وێت حەکیم حاڵ ، وێت حوکمڕانی

من یەن مەزانۆم پەنا ئاوەردەم

پەنا وە دەرگای شا عثمان کەردەم

(مینە) وەس‌کەرۆ تو لاڵە جە لام

هیچ کەس وە مەئیووس نەشیەن جە دەرگام

* * *

## شیوەن بۆ شێخ قادری شێخ حوسەینی سۆڵە

شینو واوەیلایە یاران تێتە گوێم دەنگی گرین

حەشرە ، وا سەیوانی غەم پۆشیویە ڕووی گەردوونی شین

پێم بڵێن ئێوەو خوا ، ئەسپابی ئا ئەم فیتنەیە

بۆچی ئەشراف ، تاکو ئەصناف ، ئەشقیا ، تا ئەهلی دین

یا قوڕی پێواوە ، یا ڕەشپوشە ، یاخۆ شینئەکا

یا وەکو دانیشتووە ، مەبهووتە ، ماتو دڵخەمین

ئاسمان ڕووخاوە ، خۆر گیراوە ، دونیا ئاخرە

کۆچی شێخ قادر چووە بۆ باخچەیی خولدی بەرین

بێنەوە بگرین بە کوڵ ، شیوەن بکەین گشت کوردزوان

بۆ قەڵای پشتو پەنای عیصیانی کوردی بێ موعین

دەك فەڵەك داوا ئەکەم هەر لێڵەییی بێ بەختەکەت

بۆچ کەژی سەرشاخی سۆڵەت خستە ژێر قەعری زەمین

چۆن ئەبێ دڵ خۆش بکەین ئێستە بە خۆشیی نەوبەهار

مادەمێکی چەرخی چەپگەرد ئەم بەهارە ، شاگوڵی باغی بڕین

ئەونەمامێ بوو لە گوڵزاری ئومێدی سەربەسی
بۆ تەرەققیی کورد ببێتە نەردەوانو سەرکەوین
سەیری کە دەستی قەزا چۆن دایەبەر تیغی ئەجەل
چۆنی کاولکرد بە جارێ قەسری هیوامان بەقین

* * *

## بۆ شێخ حەسەنی قەرەچێوار

دەخیلت بم وەکو عارەب بە قوربان دەستو دامانت

تەماشای حاڵی مەنسووبی سەگی بەر قاپی دیوانت

ڕەواهی غیرەتە بۆ تۆ سەگی قاپیت بۆ ئەم حاڵە

ئەسووتێ‌وو بە مەئیووسی فەقیری دیدەگریانت

مەدەد تۆبی‌و خوا ، یا پیر نەماوە قووەیی تامول

دەوایی دەردی کاریمکە ، سەروماڵم بە قوربانت

ئەوانی هیممەتو لوتفە ، دەسەوداوێنتم ئەلئامان

تەداویی زامەکانم کە تەبیبا تۆوو قورئانت

ببەخشە (مینە) بەو نوورەی کە شوعلەی ڕوویی (طه)یە

لە ڕێگەی ڕەحمەوە سەیرێ بە حاڵمکە بە چاوانت

* * *

## سـکالا

ئەوساکە هەتا دونیا دونیابوو
نەگبەت وڵاتی دانەپۆشابوو
هاوینو زوسان ، بەهار وەکو یێك
ئەهاتو ئەچوون هەریەك بە ڕەنگێك
ئیستە چون نەگبەت ڕووی‌کردووە تێمان
بەدبەختی گرتی وڵاتو جێمان
لە فیکرنایە ئەڵێن زوسانە

داییم وەیشوومەو بەورو بارانە
کە من مناڵبووم ، ئێستاکە پیرم
هەوەڵ شەوەکەی نایەتە بیرم
هەرچی ئەپرسم پێم ئەڵێن باوە
نەڕۆینە ئاغاو ، هەمە ئێڵ ماوە

ئیلاهی بە جاهـ زاتی پاکی خۆت
بە پایەو جەلال تەنیای تاکی خۆت
لابە لە سەرمان تەنگیو زەحمەتت
لابە لە سەرمان تەنگیو زەحمەتت

نەجاتمان بدە لەتۆفو باران
لە بەفرو یەخبەن ، کرێوەی زوسان

رێمان نیشاندە بەرەو رووی بەهار
دڵخۆشمان بکە بە گوڵو گوڵزار

ببووژێنەوە لە نەوبەهارا
رچیاینۆ ، مردین لە ژێر نسارا

## حاڵەتی خـۆم

موستەغریقی عیصیانم ، بێ بەهرە لە طاعەت خۆم
شەرمەندە لە قاپیی حەق ، ڕووزەردو خەجاڵەت خۆم

شانکەوتوو لە ژێر باری کرداری پڕو پووچا
ئەفگەندە سەری ڕۆژی دیوانی شەفاعەت خۆم

لاکەوتوو لە جادەیی دین ، بێ ڕێگەوو بێ ڕەهبەر
بێ سەروەت و دەستمایەیی قیامەت خۆم

ئەو ڕۆژە کە سوور ئەکرێ خەرمانی فەلاحی دین
لەو کاتە منی بەدبەخت بێ جووت و فەلاحەت خۆم

ئەو ساتە ئەسێنی حەق پارچەی عەمەلی ڕەنگین
بێ ئەمەش سورمەیی بێ ڕەنگی بێ بەلاغەت خۆم

لەو جێگە کە ڕووسوورن ، ڕووزەردی ڕیازەتکێش
مەحجووب و گوناهبارو بێ زوهیدو عیبادەت خۆم

ترسم هەیە لەو ڕۆژ ی حاکم بێت خودا ، ئەحمەد
قازی لە ئەو ڕۆژە ، پڕ سووچ و قەباحەت خۆم

ڕۆژێ کە ئەڵێن (مینە) نامەیی عەمەلت بێنە
بێ نی‌یەتی ڕەفتارو پڕ جورم و خیانەت خۆم[1]

---

(١) ئەم فە سیدەیە زۆری بەیتەکانی لەنگن ...

## پاڕانەوە لە بارەگای حەزرەتی غەوث ( قدس سرە )
## بەناوی شکایەتی حاڵەوە

ئەم عەرزوحاڵەم ئەگرم وە دەس
ئەی خەم وە خزمەت غەوث فریادڕەس

غەوثی لە نووری پاکی پێغەمبەر
غەوثی لە نوتفەی حوسەینی سەروەر

غەوثی خەلیفەی زاتی مستەفا
غەوثی مونەووەر وە نوورو سەفا

یاغوث شابازی زاتی ئەڵڵای تۆ
یاغەوث نازداری ڕەسولوڵڵای تۆ

یاغوث شابازی نازارانی تۆ
یاغەوث غەمخواری غەمبارانی تۆ

چون نووری دیدەی نووری پاکی تۆ
جێ نشینی دین شای (لولاك)ی تۆ

یاغوث پادشای مەملەکەتی تۆ
سوڵتانی هەرچوار تەریقەتی تۆ

غەوثی گەیلانی بازی یەزدانی
ڕەهاکونەندەی گشت داماوانی

پەنام هێناوە ئێستە وە دەرگات
یاغەوث پەنام دە تۆ بێ‌وو خوات
بمکە وەخاتر خووای لامەکان
بمکە وەخاتر موعجیزەی قورئان
بمکە وە خاتر ڕەوزەی پێغەمبەر
بمکە وە خاتر بوو بەکری ئەکبەر
بمکە و خاتر سوننانی عادڵ
یەعنی شاعومەر خەلیفەی کامڵ
بمکە وە خاتر کۆکردەی قورئان
یەعنی زیننورەین عوسمانی عەففان
بمکە وە خاتر شەهنشای سەردار
شێری خواوەن حەیدەری کەڕڕاڕ
بمکە وە خاتر فاتیمەی سەروەر
سەرتاپا شوعلەی نووری پێغەمبەر
بمبەخشە وە قورب عەباسی سەردار
ئەو مامەی عەزیز مصطفای موختار
بمکە وە خاتر ( دەکەسەی ) شادان[1]
موژدەی ڕەهایی وەدەس‌دریاکان
بمکە وە خاتر ئەسحابەی ڕەسووڵ
ئەم شکات حاڵەم لێ‌بکە قوبووڵ

---

(۱) مەبەستی لە ( دەکەسەی شادان )
عەشەرەی موبەششەرەیە .

بمکه وه خاتر جاهی ئه‌هلی به‌یت
شاعبدالقادر ده‌وای دردم‌که‌یت

بمکه وه خاتر زومره‌ی شه‌هیدان
بمبه‌خشه وه قورب ته‌واو سه‌عیدان

بمکه وه خاتر عه‌ودالاّنی به‌ڕ
بمبه‌خشه وه جاه مه‌ردانی ئه‌کبه‌ر

وه‌شێر مه‌ردان هه‌ر چوار ته‌ریقه‌ت
وه ئه‌ولیاکان ڕاگه‌ی حه‌قیقه‌ت

وه معجزات ئه‌نبیای سه‌رحه‌د
وه نورو ضیای زاتی پێغه‌مبه‌ر

ده‌لاڵێمۆلێت وه‌م زاتانه‌وه
وه جاهی نه‌بیو وه قورئانه‌وه

ده‌بێ بمبه‌خشی وه خاترداران
بمکه وه خاتر شای شه‌هریاران

شاعبدالقادر ئه‌وێ په‌نام ده‌ی
زامانی کاریم یه‌کسه‌ر ده‌واکه‌ی

هاوردم وه لات دڵ وه‌زامه‌وه
وه زامانی زوڵم ده‌س لیئامه‌وه

په‌نام هاوردگه وه شای گه‌یلانی
ده‌بێ په‌نام ده‌ی تو وه ئاسانی

یاغەوث من پەنام وەلات هاوردە
پەنام وە شاباز گەیلانی کردە

شاعبدالقادر غەوث فریادرەس
هەر تۆی فریادرەس داماوی بێ کەس

نابێ بە مەئیووس دەرمکەی لە لات
چون پەنام هێنا من وە بارەگات

هاوارم وە لات شاعبدالقادر
یاغەوث اعظم یاغەوث نادر

بۆ هەر مەقسەدێ پەنام هێناوە
ئەم شکات حاڵەم تقدیم کریاوە

دەبێ وە سەهلی سوڵتانی گەیلان
گشت جێبەجێکەی لە خزمەت یەزدان

ئەوەڵ ئیمانم سوپاردوە وە تۆ
بە دەس شەیتانۆ نەمکەی ڕەنجەڕۆ

دووەم شەفاعەت بۆ گوناهم کەی
لای خوا گونام یەکسەر عەفوکەی

سێهەم ڕازی دڵ وە نیازەوە
ئەمری ئیجرا بێ لە شابازاوە

بدە نەجاتم بیکە خەڵاتم
یاغەوث وەك ( مینە ) سەگی دەرگاتم

❋ ❋ ❋

## نیشتمانی

هاتە گوێم دەنگێ لە پەردەی عالەمی ئەرواحەوە
دای بە دڵدا چەن پەیامێ ئەو لە ڕووی ئیصلاحەوە

پێی وتم ئەی ڕۆڵەیی خاکیزەبوونی کوردوسان
ئەم سپارشتەم بلێ توخوا بە یەکسەر کوردزوان

لێم سوئالکە پێم بلێ تۆ کێیتو ساکێت پێ ئەڵێن
ڕۆحی کام عالی مەقامێکی لە ناو ئەهلی بەدەن

پێی وتم ڕۆحی کەریم خانی من ئەی برا
میللەتە بێ بەختەکەم بۆچی وەها پەڕپوتکرا

خاکی کوردوستان لە وەختی ئێمە وەك خولدی بەرین
جێگەیی کەیفو سروورو جەننەتی ڕووی سەرزەمین

میلەتێ سەربەستو حوڕبوو شادو بێ ئێشو ئەلەم
صاحبی سوڵطانو تاجو تەپڵو نووسینو قەڵەم

ئیستەکە چی سەیر ئەکەم ئەو خاکە جوانە سەربەسەر
ئەهلی گشت غەمگینو ماتە خۆیشی وەك ناری سەقەر

لەم هەموو شێر ئەفگەنانە وا کە چوونە خاکەوە
بەچکە شێرێ بۆچ نییە هەڵسێ بە جەرگی جاکەوە

شاعیر لە سالی ١٩٢٥ بەم پارچە شیعرە دەستی بە شیعر نوسین کردوە ، لەو دەمە تەمەنی دوانزە سالان بوەو زوبانی بە کوردایەتی پشکوتوە •

موددەتێکە بۆ ئەهالی کوردی جەرگم لەت لەتە
ئاو لە چاوم سەر ئەکا دێژی[1] شەپۆلی سەر شەتە

دائیما ویردی زوبانو فکرو دڵمە ئەم قسە
بێ زەمانێ تا نەجاتمان بێ لە ژێر ئەم زیللەتە

بووین بە جێتانەی حەسوودو خۆش دەماغیی دوشمنان
بەختە هەڵسە وەختی ڕەحمە تاکو کەی ئەم زەحمەتە

پیاوی چاك بن ئیتتحادێ ! پیاوەکانی کوردوسان
خاکی کورد فەوتا نەما هەڵسن زەمانی فورصەتە

حورڕیەتیان دا بە میسرو هەم بە سورییەو عیراق
شەخسییەت[2] دەرکەن لە بەینا ڕۆژی هەوڵی میللەتە

یەکتری تاڵانو کوشتن غایەیێکی باتیلە
شۆڕشو غەوغایی ناو خۆ شێوەیی جەهلییەتە

گشت لە سەر زیادەیی یەك بین دەس لە کوشتن هەڵگرن
ئەمڕۆ گشت قەوموو گورووهێ صاحیبی حورڕییەتە

---

(١) دێژی : ئەڵێی ، وەك

(٢) واتە : غەرەزی شەخسی •

خوێنەوارانمان ئەکەن کۆشش لە شوێن ئەم غایەیە
تا نەجاتی دەن لە ژێری حوکمی غەیر ئەم میللەتە

خوێنەواران بێ دەس‌و هەم ئێوە بێ‌ئەفکارو هۆش
کێ بکا داوای حوقووقێ ، قوڕ بە سەر ئەم میللەتە

(مینە) ڕۆحی خۆی فیدای بەر پێی شوانکتان ئەکا
وەختی خەو ڕابوردو سوبحە ، تاکو کەی ئەم غەفڵەتە

* * *

دوای حوکمی زانی‌کردن : له سالی ۱۹۳۵دا وتراوه .

مه‌دحی ئه‌گریجه‌ی په‌شێوو چاوی مه‌ست‌و پڕخومار
کولمی سوورو خالی شین‌و له‌علی لێوی ئاودار

وه‌صفی بالآی دل په‌سه‌ندو گه‌ردنی بێ گه‌ردی یار
پێم بلێن ئێوه‌و خوا ئه‌ی قه‌ومی کوردی شووم‌چار

بۆچ ده‌وامی‌کرد له‌ناو ئێمه‌دا وه‌ك باسی مار

بۆچ له ناومانا نه‌بوو خاوه‌ن عولووم‌و حیکمه‌تێ
هه‌ڵنه‌که‌وت کوردێ بکات ئه‌و که‌سبی فه‌ن‌و سه‌نعه‌تێ

کۆمه‌لێکتان ڕێك نه‌خست بۆ یه‌کێتی‌و میلله‌یه‌تێ
دائیما جاسووسی ئه‌م بیره‌ن له کوێ بێ عوشره‌تێ

گشت خه‌ریکی سینه‌ماوو تیاترۆو سارا له شار
کورده‌کان ئێوه به‌ڕاستی گوێ له من که‌ن ده‌فعه‌یێ

ئه‌م قسانه من ئه‌که‌م تو خوا مه‌لێن مه‌جبووری‌یه
به‌زلی پاره‌و ماڵ‌و سه‌روه‌ت گه‌ر بزانن زیاده‌یه

ئه‌م هه‌موو ئالتوون‌و پاره بابخه‌ینه جێگه‌یه
مه‌عمه‌لێکی پێ بسێنین بۆ توره‌ققی‌و ئیفتخار

واسیته‌ی سه‌رکه‌وتن‌و پێشکه‌وتن قه‌وم‌و وه‌ته‌ن
تابلێم پێتان ئه‌گه‌ر ئه‌بیسنۆ نامکه‌ن به په‌ن

ئەووەلا دەفعی نیزاع‌و خائینی لێل یەك مەکەن
دووهەمینیش مەکتەب‌و تەحصیلی کەسبی عیلم‌و فەن

سێ‌هەمینیش ئیتتفاق‌و یەکیەتی‌و قەول‌و قەرار
بابلێم پێتان بەڕاسی ئەی گوروهی قەومی کورد

صەد کەڕەت بێژن ئەمە شێتەو جنۆکە دەخڵی کرد
یا نەمێنێتو لە شار بیدەنە بەر دارو بەرد

پیاوەتی‌و هیممەت لە پاش بابان لە ناوی ئێمە مرد
بۆیە ئەمڕۆ بەرشەقین‌و بێ دەس‌و بێ ئیعتبار

هەر دەبێ کورد بێ لە عالەم‌دا بە کورتی ناوبرێ
تاکو دونیا ئاخری تێ ڕۆژ بە ڕۆژ تێی‌هەڵ درێ

گەورەوو ئەدنای بە یەك چاوو نەزەر سەیری‌کرێ
هەرکەسێ بێ حاکمی بێ تاوەکو ڕیشەی دەرێ

کەی بێ خوێنتان بێتە جۆش‌و غیرە تیشتان بێتەکار
گەر بەشوێنی موستەقبەل‌و حورڕیەت‌دا ناگەڕێین

چەند ئەدیب‌و چەن شەریفێ بۆ خوا سا ڕاپەڕێن
هەروەکو «مینە» بە شوێن ئەم غایەوو بیراگەڕێین

حەقی خۆتانە ، مەترسن ، حەققە خۆسەر نابڕێین
ئیستیقلالێکی زاتی وەرگرین گشت‌کوردیار

## بۆ ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ .

دێتەکوڵ خوێنی گەشی لاشەیی مەقتوول
ئەم قەومە ئەسێنێ حەققی ڕۆژی شەشی ئەیلوول

مەعلوومە کە گومنابێ لە ناو میللەتی کوردا
جێگیرە لە توێی مێشکی هەموو گەورەوو وردا

نووسراوە جە خوێنی گەش و ئەنگوشتی کوژریاو
کوردینە حەقی ئێمە مەخەن ئێوە ئە بنی ئاو[1]

بە ئەو خوێنەی کە ڕژیایە ئەبەر[2] قاپیی سەراتان
تەسدیقی بکەن خوێنی سیاوەحشە لە لاتان

* * *

---

ئە : لە

ئەبەر : لەبەر

## شەڕنامەی شێخ مەحموودی نەمر

ئەم شەڕنامەیەم بۆ گشت گەلی کورد
بۆیە نووسیوە تێ بگەن وردورد

شێخو گەورەکان لەسەر تۆڵەی کورد
بە گیانو بە ڕۆح خەباتیانکرد

جێیان بە شاخۆ یان لە سەری بەرد
ئەی گەل هەر شێخو هەر بەگو خان بوون

لە ڕێگەی کوردا فیدای گیان بوون
گشت دەس بە تفەنگ ڕۆژی مەیدان بوون

یا دەستە بەستی ناوی زیندان بوون
یا بە سەر شاخۆ بێ ئاوو نان بوون

کێ بوو دەربەنی گشت سوورکرد بە خوێن
هەر لە چەمچەماڵ هەتا بەر دەربەن

داپۆشا بە لەش وەك دارو دەوەن
خوێنمژی کوردی تیا کرد بە پەن

تا زامارکرا شێری شێرڕەسەن
کێ بوو لە ڕۆژی بەردەرکی سەرا

له ئاوباریکا وا دەورەدرا
له ناو دۆڵێکی بێ پەناو دەرا

نۆ سەعات وەك یەك کەوت له سەنگەرا
له ئەرزو ئاسمان تیرباران کرا

چل ساڵ شێخ مەحموود خوێنی کرد بە ئاو
هەر له بۆکانۆ هەتا بەصرەو فاو

ئیستە کوڕێکی پەرچەم دەقدراو
بە کلاوێکی بە حەوت ڕەنگ نەخشاو

کوردەو شێخ مەحموود خوێنمژ بوو بە ناو
خۆ شێخ مەحموودیش خۆی تەنها نەبوو

بێ براو بێ پشت بێ هاوپا نەبوو
بێ بەگ‌و بێ خان بێ ئاغا نەبوو

ساتێ دەرەبەگ له ئەو جیا نەبوو
بۆیە تا ئەو بوو کورد ئاوا نەبوو

سێ دارەم بدەن دەرکێشن گیانم
له یەك جیایی‌کەن جمگەو ئێسقانم

ئەگەر چوار پەنجە بیبوڕن زوانم
من ڕاستی ئەڵێم درۆ ناتوانم

ئەم چەن سەردارە بە کورد ئەزانم
ئەوەڵ شێخ مەحموود دارای سێ‌صەد دێ

جا چۆن ڕووت هەیە بچیتە دیوان
چۆن ئەدەی جواو زاتی لامەکان

ئینجا ئەنالّی ئەکەی ڕۆلە ڕۆ
پشت دەس ئەمالّیت ئەکەی ڕۆلە ڕۆ

عومری بە بێ چوە کەم ڕۆلە ڕۆ
ڕووزەردی لای حەق بووگەم ڕۆلە ڕۆ

زوان بە ڕۆڕۆ ئەتبەنە دواوە
غەیرەز جەهننم جێگەت نەماوە

کە من لە دنیا وەها حالّی بم
خەوەردار لە ئەمر زولجەلالی بم

ئەبێ چۆن لەبەر براو ئامۆزا
یا لەبەر کەیفو خۆشی ڕووی دونیا

تەرکی ڕۆژگ‌و نوێژ یا تاعەت کەم
خۆم سەرەفکەندەی قیامەت بکەم

---

نێکی : چاکە ٠

## مێژووی لەدایكبونی حمە سعیدی حمە بەگی ئامۆزام

فەرەحدەر وەك نەسیمی بەربەیانی
فەرەحدەر وەك نەنسیمی بەربەیانی

شەوێ عالیشەرەف پڕزەوقو شادی
فریشتە یەك بە یەك ئەیدا مونادی

کە ئەمشەو ساعەتی لوتفو سەخایە
سەراپا شوعلەیی نووری خوایە

لەیومنو حورمەتو فەیزو سەوابی
خەزێنەی لوتفی حەق کریا وە قابی

کەرەمکریا بە توولی عومرو تالع
سەعید ئەو شەو بلێێ وەك دوڕڕی لامیع

لەپاش ئیزهاری شوکری زاتی باری
بۆ مێژووی چوومە ناو باغی بەهاری

کەچی فەرمووی ئەدیبێکی موئەڕڕیخ
بڕۆ بیکە بە غونچەو سەروو تاریخ

( ١٣٤٣ی کوچی )

## مێژووی لەدایكبونی سەرداری داود بەگ ٠

شەوێ پڕ لەكەیف هەروەك شەوی عید
پڕ شەوق بوون بە نوور موشتەریو ناهید

لە جوانیو فەزای ئەو شەوەی پڕنوور
هەڵگیرا دەرگای خەزێنەی غەفوور

كریا بە خەڵات خەڵاتی شاوار
لێل سوپای بەختو سەعادەت سەردار

بە كەیفو سروور بە خۆشیو شادی
فریشتەی ئەكرد موبارەك بادی

مێژووی كرد وەلێ بە زەوقو دەماغ
مێژووی بە بصولەو سمنەو گوڵەباغ

١٣٥٣

---

## مێژووی لەدایکبوونی عەلی کەریم بەگ

شەوێ موبارەك وەك شەوی بەرات
ڕوونو مونەووەر ئەرزو سەماوات
لە خەزنەی و لوتفی کەرەمفراوان
کەرەم بوو عەلی وەعدەی بەربەیان
لەپاش بەیانی شوکرو تەحەددوس
منیش بۆ تاریخ کردم تەفەححوس
مێژوودیی عومری ئەکەم لە گوڵشەن
بە لالەو گوڵو غونچەو یاسەمەن

۱۳۵۳

---

## مێژووی لەدایکبوونی دارای داود بەگ

موبارەك ڕۆژێ هەروەك سوبحی نەورۆز
سەفادارو فەرەحبەخشو دڵئەفرۆز
کراوە قاپیی ئیکرامی مەعبوود
لە داوەر بۆکەرەمدارایی مەسعوود
لەپاش شوکری فراوانو پەیامی
وتی پێم باوکی تۆ مێژوو بڵێ بۆی
وتمڕەببی سەعادەتباری ئەو بێ
بە مێژووی بەختو طالع یاری ئەو بێ
۱۳۵۸

## مێژووی لەدایکبوونی فەتاحی کەریم بەگ

شەوێ وەك لیلة القدری مکرم
مونەووەر بوو هەموو ئەقتاری عالەم
بە جەوزا موشتەری ئەیدا ئیشارەت
شەوێکە پڕ سەفاو کەیفو بەشارەت
کەرەمکریا بە گەنجینەی کەرەمکار
فەتاح ئەو شەو بە بەختو تالعی یار
بە مێژووی دای‌نیا تاریخ‌سەنجێ
هەزارو سێ‌سەدو پەنجاو پێنجێ

---

## مێژووی لەدایکبوونی قادری ڕەزابەگ

شەوێ موبارەك وەك شەمەی شەریف
کە بارك‌اللەی بۆ بووە تەعریف
ئەو شەو بە خۆشی موژدەیان ئەدا
نەجمی سەعادەت لە بورجی سەعدا

لادرا قاپی خەزێنەی ئەلطاف
قادر بەخشرا بە ڕەزایی جاف

بەشیر بە باوکی زوو ئەم موژدەی‌دا
باوکی بۆ مێژووی ڕووی کرد بە لاما
جوابم دایەوە بە موئەڕڕیخێ
بەهـ بەهـ بە غونچەو سروە تاریخێ

١٣٥٦

## مێژووی سالاری داود بەگ

شەوێ شیرین‌و دلکەش وەك شەوی عید
جهان ئەفرووز بوو ئەو شەو میهرو ناهید

دوو شەو زیلحەججە مابوو بۆ موحەڕڕەم
لە خەزنەی ڕەحمەتی خەللاقی ئەکرەم

کەرەم‌کریا بە ئەمری حەیی دادار
کوڕی خۆش‌بەخت‌و تالع‌ناوی سالار

موئەڕڕیخ کردی تاریخی موبارەك
بە تاهاو ئیقرەئو شەمس‌و تەبارەك

١٣٥٧

---

## مێژووی بارامی ڕەزابەگ

شەوێ نوورین وەکو بەختی سەعیدان
بە شەوق‌و شوعلە نوورین ، پاکی دەوران

بە سروەی بای نەسیم ئەو شەو سەراسەر
موعەتتەر بوو بە عەتری میسك‌و عەمبەر

شەوی جومعە شەوی بەرزو شەرەفدار
کراوە قاپیی بەخشینی دادار

لە خەزنەی زاتی حەق کریا کەریمێ
کوڕێ نەك کوڕ بلێ دوڕڕی یەتیمێ

لەدوای خۆشی‌و ئەدایی شوکری یەزدان
بە کوردی ناونرا بارامی کوردان

موئەڕڕیخ کردی تاریخی موبارەك
بە هودو ئیقرەئو شەمس‌و تەبارەك

## مێژووی شاهۆی مصطفی بەگ

ڕۆژێ منەووەر بە نووری یەزدان
نۆزدەهەمینی مانگەکەی قوربان

هاتە بەخشینی ڕەحمی زاتی حەی
هەڵگیرا قاپیی خەزێنەی بێ پەی

بەخشیا بە ئەمری سوڵطانی داوار
کوڕێ بە وێنەی گەوهەری شاوار

هەروەك دەروێشان زاتی بێ هەمتا
من بۆ مێژوویی گەلێ هەوڵمدا

سەحەر هاتفێ فەرمووی بە هیجری
شەصتپەڕو نەسرین بە مێژووی عومری

**١٣٦٨**

## مێژووی لەدایکبوونی محموود سەرتیپ ، ١٩٤٦/٩/٩ـ ١٣٦٦ھ

بە نۆی ئەیلوول‌و پایز فەسڵی دڵکەش
بە ڕۆژی شەممەیی عالی سەعات شەش
لە عەین‌و فەیضی ئەو ڕۆژە سەماوات
منەوەرتر لە ڕۆژان بوو بە صەدقات
بە پەروین موشتەری ئەیدا مونادی
جهان پڕ بوو لە زەوق‌و کەیف‌و شادی
بەشیرێ هات‌و هاوردی بەشارەت
غەم‌و ئێشی دڵی بردم بەغارەت
وتی ئەمڕۆ لە گەنجینەی کەرەمکار
بە تۆ دریا کوڕێ وەك دوڕڕی شاوار
کوڕێ مەسعوود صاحب بەخت‌و ئیقباڵ
بە نۆی ئەیلوولی هەژدەی مانگی شەووال
لە ئینعام‌و عەطایی داوەری حەی
وتم حەمدو ثەناوو شوکری بێ پەی
کرا مەولوودو نەزرو شایی تەرتیب
بە ئارا ناونرا مەحموود سەرتیپ
موئەڕڕیخ کردی بەحری ئەبجەدی تەی
وتی مێژوو بە سەروو غونچە هەی هەی
١٣٦٦

## مێژووی لەدایکبوونی حەسەنی کەریم بەگ

لە وەقتی شەفەق کردی نومایان
لە خەزنەی لوتفی کەرەمفراوان

کردی بە کەرەم دارای دادار
حەسەن وە وێنەی گەوهەری شاوار

چونکە بە شێوەو بە ڕوو حەسەن بوو
بە ئارا ناوی حەسەن پەسەن بوو

بە شوکرو شادی کرا گوێزەبان
من بۆ تەئریخی تێکۆشام بە گیان

گەلێ مائیل بووم چوومە لای پیرێ
چ پیرێ ، داناو وریاو دەسگیرێ

وتی بۆ تەئریخ مەبە بێ دەماغ
ئاوەو سومبلەو بەصولەو گوڵباغ

